# بەسەرهاتی هاروت و ماروت و ئەوەی تێی کەوتن لە تاوان

باسێك بۆ شوێن کەوتوانی سەلەف

وەرگێڕانی

طارق الكردی

## | باسێک دەربارەی هاروت و ماروت دوو مەلائیکەی الله لەگەڵ ئەو تاوانانەی ئەنجامیان دا |

بەسەرهاتێک کە لە کتابەکانی تەفسیر و ریوایات هاتووە و سەلەف نەقڵیان کردووە و قەبوڵیان کردووە بەبێ ئەوەی ڕەتی بکەنەوە و طعنی لێبدەن ئەویش بریتیە لە بەسەرهاتی دوو مەلائیکەی ئاسمان.

بـەم جۆرە هاتووە لە هاوەڵان ابن مسعود و ابن عباس و علی رضي الله عنهم...

ابن عباس دەفەرموێت : دوای ئەوەی خەڵکی لەدوای ئادەم کەوتنە تاوان و کوفر ، مەلائیکەکان وتیان ئەی پەروەردگارا ئەو بەندانەی بۆ عیبادەت دروستت کردن ئەوەتا کەوتونەتە تاوان و کوفر و خوێن ڕێژی و زینا و حەرام خۆری ودزی ئەوجا پێیان وترا دوو مەلائیکە لە خۆتان هەڵبژێرن تا فەرمانیان پێبکەم و ڕێگریان لێبکـەم ، ئـەوانیـش | هاروت و ماروتیان | هەڵـبژارد و دابـەزێنـرانە سەرزەوی ، ئەوجا شەهەواتی بەنی ئادەمیان پێدرا ڕێگریان لێکرا لە " زینا و دزی و خوێـن ڕێـژی و تـاوانەکانـی دی " زەمـانێـک مـانەوە لـە زەویدا و لـە نێـوان خەڵکـی حوکمیان دەکرد ، ئەمەش لـە زەمانـی پێغەمبەر " ئیدریس " بـوو علیه السلام.

ئـا لـەو زەمانەدا ئافرەتێکـی جـوان هەبوو بەوێنەی ئەستێرەی زوهرە لە نێو ئەستێرەکانی تردا ، چـون بۆلای ئـەو ئافرەتە و دەنگیان نـزم کردەوە و ویستیان زینای لەگەڵ بکەن ، ئەویش ڕازی نەبوو تاوەکو نەچنە سەر فەرمان و دینی ئەو ، پرسیاریان لێکرد سەبارەت بەدینی ، صەنەمێکی دەرهێنا .

وتـی : ئەمە دەپەرسـتم ، ووتیان : پێویستمان بەپەرستنی لەم جۆرە نیە و پاشان ڕۆشتن تاماوەیەک دیار نەمان پاشان هاتنەوە و ویستیان زینای لەگەڵ بکەن ڕازی نەبوو پاشان ڕۆشتن و هاتنەوە و هەمان ویستیان هەبوو ئافرەتەکەش

هەمـان داوای هەبـوو ئەوانیش ڕازی نـەبوون ، کـە زانـی ئـەم دوانـە ڕازی نابن صەنەم بپەرستن پێی وتن : سێ پێشنیارەکەم یەکیان هەڵبژێرن ، یان صەنەم بپەرستن ، یان ئەم نەفسە بکوژن ، یان ئارەق بخۆنەوە .

وتیان : هەمـوو ئەمانە مەعقول نیە ئاسانترینیان ئـارەقەکەیـە خواردیانەوە ، پاشان سەرخۆش بوون و لەگەڵ ئافرەتەکەش زینایان کرد لە ترسی ئەوەی پێیان بزانن نەفسەکەشیان کوشت .

کاتێـک بـەهۆش خـۆیان هاتنـەوە سەرخۆشیان نەما زانیـان چ تـاوانێکیان کردوە ویستیان بەرزبنەوە بۆ ئاسمان نەیان توانی پاشان پەردەی نێوان ئەوان و مەلائیکەی ئاسمان ئاشکرابوو زانیان کەوتونەتە چ تاوانێک ، زۆریان پێ سەیربوو.

پاشـان داوای لێخۆشبونیان بـۆ ئەهلـی زەوی کـرد کـە پـێشتر ڕەخنـەیان لێدەگرتن.

پـاشان پێیـان وتـرا : هەڵبژێـرن لـە نێوان سـزای دونیا و قیامەت ، سزای دونیایان هەڵبژارد چونکە کۆتایی دێت ، بۆیە نێردرانە بابل بۆ ئەو سزایە .

( تفسیری ابن أبی حاتم - ١٠١٢ )

حاکم دەڵێت : ئەم حەدیثە اسنادەکەی صەحیحە

زهبی ـش تەعلیقی لەسەر داوە و دەڵێت : صحیحە٢/٤٨٠ المستدرک.

کعـب دەڵێت : مەلەئیکە باسی تاوانی مرۆڤیان کرد وە ئەوەی تێی کەوتون لـە تـاوان و خراپـە ، پێیـان وتـرا دوان لە باشترینـی لـەخۆتان هەڵبژێرن لـەناو مەلائیکەتەکان .

| هـــاروت و مــــاروتیان | هەڵبـژارد

وتـرا : دابەزنە سەر زەوی ، پێغەمبەر نێردراوە بۆ لای ئادەمیزاد بەڵام بۆلای ئێوە نانێردرێت بۆیە هـــاوبەش ئەنجام نەدەن بۆ من زینا مەکەن ، ئـارەق مەخۆنەوە.

كعب دەڵێت : ئێوارەی ئەو ڕۆژە تەواو نەبوو ئەوەی لێیان قەدەغەکرا ئەنجامیان دا.

( تفسير ابن أبی حاتم - ١٠١٣)

ابن عومەر لە باسکردنی ئەم بەسەرهاتە دەڵێت :

دینی ئافرەتەکە مەجوسی بوو ، وە داوای لێکردن بێنە سەر دینی وتیان : ئەوە شیرکەو ئێمە کاری وا ناکەین ، پاشان بە ملائیکەکانی وت : من هاوسەرم هەیە پێم بزانێت ئابڕوم دەچێت ، بۆیە گەر اقرارتان کرد بەدینەکەم و لەگەڵ خۆتان بەرزتان کردمەوە بۆ ئاسمان ئەوا ڕازیم بەوەی دەتانەوێت ، ئەوانیش اقراریان کرد و ڕازیبوون .

لە دوای ئەنجامدانی تاوانەکە بەرزبونەوە بۆ ئاسمان بەڵام باڵیان شکا و کەوتنە خوارەوە ، بۆیە دەستیان بە گریان کرد و داوای لێ خۆشبونیان کرد پێغەمبەرێک هەبوو دوعای دەکرد لەنێوان دوو جومعەدا هاتن بۆلای و داوایان لێکرد داوای لێ خۆشبونیان بۆ بکات ، دوایی دووجار چونەوە بۆلای پێی وتن : لە نێوان سزای دونیا و ئاخیرەت یەکیان هەڵبژێرن ئەوانیش سزای دونیایان هەڵبژارد . ( تفسير ابن أبی حاتم - ١٠١٤ )

ابن کثیر لەتەفسیرەکەی دەڵێت : ئەمە سەنەدەکەی زۆر بەهێزە.

هەرچەند لەدوای جێگیربونی سەنەدەکەشی دواتر ئینکاری دەکات بەڵام بۆچونی ئەو بۆ ئێمە گرنگ نیە لەپێشی سەلەفەوە.

ابن عباس دەڵێ : ئافرەتەکە پێی دەوترا " مناهيد " کاتێک دوو مەلائیکەکە ویستیان بچنە لای داوای لێکردن سوجدە ببەن بۆ بتەکەی وە ئارەقەکەی بخۆنەوەوە منداڵەکەی دراوسێشی بکوژن ، وتیان : سوجدە نابەین ، پاشان ئارەقیان خوارد و منداڵەکەشیان کوشت وە سوجدەشیان برد .

( تفسير ابن أبی حاتم - ١٠١٥)

عبدالرحمن بن حسن لە فتح المجید دەڵێت : ئەم ئەثەرانە سەلەف و ئەهلی ئەثەر قەبوڵیانکردوە لەوانە ( ابن عباس ، مجاهید ، عکرمە ، سعید بن جبیر ، وە لە طەبەقەی دوەم قتادە و سدی )

ئەم بەسەرهاتە لەم کـــــتابانە هاتووە :

- سعید بن منصور فی سننه.
- الحاکم فی مستدرک.
- عبدالرزاق فی تفسیره.
- ابن ابی شیبه فی المصنف.
- ابن أبی الدنیا فی العقوبات.
- البیهقی فی شعب الإلیمان.

ابن حجر لە کتابی عجاب فی بیان الأسباب دەڵێت : پێویستە بەوردی تەماشای وتەی ئەوانە بکرێت کە ئەم باسە ڕەد ئەکەنەوە عجیب لە کەسانێک پێیان دەوترێت ئەهلی حەدیث و بە حافظ ناسراون چۆن هەموو ئەمانە ڕەت ئەکەنەوە و ئینکاری دەکەن ، لەکاتێکدا بە ئیسنادی زۆر بەهێز و ڕاست لەکتابەکانی سەلەفدا باسکراوە بە زۆر ڕێگا ، وە دەشڵێت : من دەڵێم لەم باسەدا سەنەدی ضعیف و صحیح بونی هەیە ، بەڵام ناکرێ هەمووی ڕەت بکرێتەوە هەرگیز.

والحمدلله.

**وەرگێڕانی : طارق الکردي**

**کۆتا پێداچونەوە**

**١٠/٩/٢٠٢١**